لەدوورەوە ڕوانین لە دوکانی توتن فرۆشەکەی؛

# فێرناندۆ پێسوا

و-ئ: ڕێدین عطار

## لەبری پێشەکی

ئەگەر بەدوای شیعری ڕوون و سەرڕاستدا دەگەڕێیت، واباشترە هەر بەم نزیکانەدا بێیت و بچیت و زۆر دوورنەکەویتەوە، بە سۆراغی سوپای گەورەی شاعیران بڕۆ، هەندێکیان لەم قەرەباڵغیەدا شیعرەکانیان تێگەشتنێکی ئاسانتریان هەیە، بەڵام گەر تۆ مرۆڤێکی نەرمەقوتەخۆر و ئاسان نیت بنواڕە لە دەستنوسەکانی ئەم پیاوە پارچەپارچەیە کە؛ هەر پارچەیەکی بە دیوارێکی وجوودی خۆتدا دەتداتەوە؛ بۆ شیعری پێسوا دەبێت هەمیشە فریابکەوین و بپەردەژێینە سەر گۆشە نادیارەکانی ئاگایی و نائاگایی و واقع و هاتنوچوونە بەردەوامەکانی لە نێوان کەتوار<واقعییەت> (واقعییەت چییە؟) و خەیاڵ ئەزموونەکان.

بابەتەکە کاتێك ئاڵۆزتر دەبێت کە بە کۆمەڵێك کەسایەتی ئاشنا دەبین کە لەبری پێسەوادا دێنە گۆ بۆمان و لەبەر خۆشیانەوە قسەدەکەن دیسان هەر لە بر و جێگای ئەو. ئەم کەسایەتییانەش چ نەخۆشییەکی دەرونی قورسی پێسەوا بووبن چ شێوازە هەڵبژاردنی ئەو بۆ چێکردنی بەرهەمەکانی، ئێمە ڕووبەڕووی چەندین کەسایەتی جیاواز و دۆخی جیاواز دەکاتەوە، واتایی-مرۆییەن و واتای-ژیانیەن و وجودیەن، وە ئەگەر بەشێوە نواڕینێکی قەدیمی(کلاسیکیەن) ژیان و بیرکردنەوەکانی؛ شاعیریش لە فەهم و دەستەبەندی شیعرەکانی بەشداری پێبکەین، بەلایەنی کەم ڕووبەڕووی سێ هاوزای بنچینەیی پێسەوا دەبینەوە؛ کە هەریەکەیان پێشینە و بیرکردنەوە و زمانی تایبەت بە خۆیان هەیە.

فێرناندۆ پێسوا شاعیری پرتوگالی و لەدایکبووی 1888 لە لیشبۆنە، کە بەهۆی هاوسەرگیری دایکییەوە لەگەڵ پیاوێك کە سەرکونسوڵی پرتوگال بوو لە ئەفریقای جنوبی، منداڵییەکی پڕ هەوراز و نشێوی گوزەراند. کاتێك دووبارە گەڕایەوە بۆ لیشبۆنە تەمەنی 17 ساڵ بوو دوای دوو ساڵ بڕیاری دا واز لە زانکۆ بهێنێت، خوێندنەوە و نوسینی بەشێوەیەکی زۆر جدی و قوڵتر دەستپێکردەوە. هەرچەند پێسوا لە بڵاوکراوە و ڕۆژنامەکاندا وەك شاعیرێکی جدی ناسرابوو وە ناوی لە نزیك ناوی ئەدیبانی گەورەی جیهاندا دادەنرا و دەهێنرا، بەڵام بینین و ئاشکرابوونی تەواوی شیعر و نوسراوە بنچینەییەکانی لە دوای مەرگی لە 1935 ڕوویدا؛ کە لە سندوقێکی گەورەدا زۆربەی دەستنوسەکانی دۆزرانەوە و لەوێشدا بۆ ماوەیەکی زۆر دیاربوو دانرابوون، لەوە بەدوا زیاتر کەوتە بەرچاو و دیدی شاعیران و خوێنەران و ئەدیبانی جیهان؛ هەر لێرەوەش بوو کە جیهان بەتەواوی بەم پیاوە بێدەنگە لێوڕێژە ئاشنابوو.

## تێکچوونی چەند کەسایەتی

بوونی چەند کەسایەتیەکی خەیاڵی و بەرچاوکەوتنی ئەم کەسایەتیانە لە نوسراو و شیعرەکانیدا بە ڕادەیەك لە ژیانی پێسەوادا جدی بوو کە بەرهەمەکانی زۆرێك تا ئێستاش وادەزانن هی خۆی نیە و کاری ئەو کارەکتەرانەیە کەخۆی ناو و کەسایەتی بۆ داتاشیون. هاوزا داهێنراوەکانی؛ هاوزا داهێنراوەکانی پێسوا دەنوسن و دەگێڕنەوە، شیعر دەهۆننەوە و دەژین! هەریەك لەم هاوزایانە، ناو و تایبەتمەندی و ژیان و کەسایەتی تایبەت بە خۆیان هەیە، هەندێك جار هێندە زیندوون کە لەسەر نوسینەکانی یەکتری؛ ڕای تایبەت بە خۆیان دەربارەی بەرهەمەکانی یەکتری هەیە.

هەرچەندە سوود وەرگرتن لە <ناوی خوازراو> بۆ دانانی لەسەر ناونیشانی نوسەری ئەسڵی بەرهەمەکان بە دەست ئەنقەست لەلایەن زۆر نوسەر و شاعیرەوە ئەنجام دراوە زۆر کات، بەڵام بۆ پێسەوا <ناونان> و <ناوی خوازراو> بابەتێکی زۆر لەوە زیاتر و ئاڵۆزترە، سێ هاوزای سەرەکی ئەو کە پێکهاتوون لە: (ئەلبێرتۆ کایرۆ) کە نیشتەجێی لادێیەك بوو و نەیخوێندبوو، خودا پەرست و شەیدای سروشت و تێگەشتنی تایبەت بوو بۆ شتەکان. کایرۆ بەو شێوەیەی کە پێسوا ئاماژەی بۆکردووە لە ساڵی 1887 (یەك ساڵ پێش لەدایکبوونی خودی شاعیر) هاتۆتە دنیاوە لە 1915 بە نەخۆشی سیل کۆچی دوایی کردووە. (ئەلڤێرۆ دی کۆمپۆس) کە لەدایکبووی 1890 و ئەندازیارە هێزی دەریایی و نیشتەجێی بەریتانیا و لەژێرکاریگەری (واڵت ویتمان) و فۆتۆریستە ئیتاڵییەکان بوو.

(ڕیکاردۆ ڕیش)یش کە؛ پزیشکی دەسەڵاتخوازبوو، شیعری کلاسیکی بە شێوەیەکی کلاسیکی باوباپیرانی دەهۆنییەوە. سەرەڕای ئەمانە ژمارەیەکی زۆر ناوی تر بوونی هەیە کە پێسوا لەژێر ماسك و ناوی واندا نوسراوەکانی نوسیووە و شیعرەکانی هۆنیوەتەوە، وەك؛ *بیرناردۆ سوارێز، ئەنتۆنیۆ مۆرا، بارۆن تیۆ* و تەنانەت ژنێك بەناوی *ماریا خۆزێ*ش. پێسەوا لە شوێنێکدا دەربارەی ئەم کەسایەتیانە نوسیویەتی:_ *(من گۆشت و خوێن(ڕۆح)م دا بەهەموو ئەمانە، تواناییەکانیانم هەڵسەنگاند، هاوڕێکیانیانم ناسی، گفتوگۆکانیانم گوێ لێگرت... وادێتە پێش چاوکە لە نێوان ئەوانەدا، خولقاندنیان کەمترین شتێکە من کردبێتم... وەك بڵێی هەموو ئەوانە جیا و بێ دەستکاری من ڕوویان دەدا و هەروەها بەردەوامیش بوون لە ڕوودان).*

**دەربارەی شیعری دوکانی تووتن فرۆشەکە:**

شیعری دوکانی تۆباکۆفرۆشی؛ یەکێکە لە گرنگترین کۆمەڵە شیعرەکانی فێرناندۆ پێسوا، ئەڵبەتە ئێمە لە شیعردا شتێکمان نییە بەناوی گرنگترین و نا گرنگترین، بەڵام بۆ تێگەشتن لە دنیای شیعری ئەو بەتایبەت لە قاڵبی کەسایەتی(ئێلڤارۆ دیکەمپۆس) خوێندنەوەی ئەم شیعرە پێویستییە(زەرورەتە). لەوانەیە بەهۆی خێرابوونی هەموو شتێکی ڕۆژگار و سەردەمی نوێوە خوێندنەوەی شیعری دوورودرێژ بۆ زۆرێك لە خوێنەران کارێکی قورس و موشکیلاوی بێت، پێشوازی زۆرینەش بۆ خوێندنەوەی لەم جۆرە شیعرانە زۆر کەم بوویێتەوە، بەڵام ئەگەر دەرگیری دونیا و فەزای شیعر بووبیت بەڕاستی، هەروەك موشاهەدەکارێك دەتوانیت بەدرێژایی ساڵانێکی زۆر چێژی لێ ببەیت و هەر جارێکیش جوانییەکی نوێ لەناویدا دەستکەوێت و بدۆزیتەوە.

ڕوانینی پێسوا بۆ ژیان هەر لەو سەرەتایەوە ڕوونە؛ ***من هیچم| هیچ ناتوانم| ناشمەوێت ببم...*** وە هەموو شتێك هەمان ئەم ڕوئیایانەیە کە بەهای من و لەوانەیە بووونیەتی منیش دروستبکات وەك شاعیرێك و تەنانەت لە پێگەی مرۆڤێکدا. هەرچەندە شیعر زۆر ناپەردەژێتە سەر ماهیەتی ئەم ڕوئیایانە و هەندێك کات ئاماژە بۆ بابەتێك دەکات کە زیاتر پەردەژاوەتە سەر پرۆسەیەك کە؛ ئەم ڕووئیایانە تێدا ڕەنگی خۆیان لەدەست دەدەن، بەڵام هێزی ئەم ڕوئیا و فکر و بیرکردنەوانە بەشێوەیەکە کە؛ جێگا بە کەتوار لەق دەکەن و هەندێ جار ئەسڵەن کەتوار (واقعیەت)یش لە ڕەوایی خۆی دەخەن.

لە دونیا و فەزای ئەم شیعرانەدا بەردەوام گەواهیدەر و بینەری هاتن و چوویەکی زۆرین؛ لە نێوان فەزای کەتواری _واتە فەزای ژوورەکە، جادەکانی دەرەوە، کۆمەڵێك دووکانی نێو بازاڕەکە کە شاعیر لە دوورەوە سێریان دەکات_ وە دونیای زیهنی شاعیر کە هەریەك لەم فەزایانە دێنە پێشەوە و پێناسەگەلی نوێ لەوانە بە خوێنەر دەبەخشن. ڕێژەی واقعیبوون و خەیاڵیەتی ئەوانە بەرووداو دەدرێتەوە و بەدرێژایی شیعرەکانی دیدگا فەلسەفی و ئەندێشەییەکانی زیاتر ڕۆشن دەکاتەوە، ئەوەمان بۆ دەردەخەن شیعرەکانی ؛ فەلسەفەگەلێکی شکڵگرتووی هەیە لە خەڵوەتی شاعیری خۆیدا کە؛ تەنانەت فەیلەسوفی وەك کانتیش(لەخەڵوەت و دۆخدا) دەستی پێی ڕانەگەشتووە. دونیای پێسوا دنیای ڕووئیاگەلی ڕەهاکراوە، شیعرەکانی وەك کۆمەڵێك درەختی باخچەیەکن کە هەندێکیان وشك بوون هەندێکیشیان بێوێنە و سەرسوڕهێنەرانە گەشەیان کردووە و لق و پۆیان کردووە. لە دونیای شیعرەکانی پێسوادا ئێمە ڕووبەڕووین لەگەڵ دونیایەکی مرۆییشدا، لەنێوان ئەوەی خۆی دەیەوێت و ویستوویەتی لەگەڵ ئەوەی کە ژیان دەیەوێت و بۆی ویستووە لەسەر ئەو و بارکراوە و بەبارکراویش وەك خۆی ماوەتەوە، لەم نێوەندەدا تاقانە کەتواری بەبەها و بەنرح بوونی ڕووئیاکانە، کۆمەڵێك ڕووئیا کە لەسەر شیعرەکانی دەنیشن و هەروەك <ژیان> میوەگەلی تاڵ و ترش دەدەن.

# دوکانی تووتن فرۆشەکە

من هیچم
هیچم؛ هەم
هیچ کاتیش؛ نابمە هیچ شتێك
زۆر لەوە بێ توانا تریشم تەمەنا بکەم
ببمە هیچ شتێك ڕۆژێك
سەرەڕای ئەمەش
هەموو ڕوئیا و خەونەکانی ئەم جیهانە
لەنێو مندایە.

پەنجەرەکانی ژوورەکەی من!
-یەکێك لە ملیۆنان ژوورەکانی ئەم جیهانە، کە هیچ کەس نازانێت کێ لەناویدا نیشتەجێیە-
(گریمان نیشتەجێی یەکێك لەو ملیۆنان ژوورەشمان ناسی، لەباریەوە بەڕاستی چی دەزانین؟)
ئێوە پەنجەرەیەکی کراوەن بەڕووی ڕازێکی بازاڕیدا، ڕازی ژێرپێکەوتنی مرۆڤەکان لە شەقامەکاندا
کۆمەڵێك شەقام کە؛ هەموو دەرگاکانی بەڕووی بیرکردنەوەدا لە مێژە داخستووە
واقعییە، بەشێوەیەکی نەگونجاو؛ واقعی
ڕوون و ڕەوانە، بەشێوەیەکی نامۆ ڕوون و ڕەوان
شەقامێك کە زەوی ژێر پێی گیاندارەکانی
قوڵتر و؛ لەژێر بەردە بێگیانەکانی نهێنییەك، ڕازێك خۆی حەشارداوە
مەرگێك کە لەودایە، دیوارەکان شێداردەکاتەوە و مووی مرۆڤیش سپی تر
چارەنوسێك لەودایە؛ شەمەندەفەری هەموو شتێك لە نشێوی ڕێگاکانی نەبووندا دەئاژوێت

ئەمڕۆکە وەها تێکشکاومەتە نێوخۆم؛ وەك بڵێی حەقیقەتێکم زانیبێت
ئەمڕۆکە هێندە زوڵاڵە دۆخم، دەڵێی لەپێشدەرك و ئاسانەی مەرگدا ڕاوەستاوم
هیچ پەیوەندیەکم بە شتەکانەوە نەماوە، جگە لە ماڵاوایی کردن :
ئەم ماڵە و ئەم گۆشەی شەقامانە
گۆڕاون بە واگۆنی شەمەندەفەرێك
کە بە تەتەڵەکردنی بێبڕانەوە کەوتوونەتە ڕێ بە؛ دەوری سەرمدا
ڕەوانە دەبن لەسەر ڕووی لەرزینە دامارییەکان و ژەوژی ئێسکەکانم

ئەمڕۆکە ئاڵۆز و سەرلێشێواوم
وەك ئەو کەسەی کە بیری کردەوە، گەشت بە وەڵامێك و ...لەبیریشی چوویەوە
ئەمڕۆکە دابەش بووم، لە نێوان وەفاداریم بۆ بوونی تووتنفرۆشەکەی سەرگۆشەی شەقامەکە
بەناونیشانی کەتوارێکی ڕواڵەتی...دەرەوەڕا <دەرەوەیی>
وە ئەو هەستەی کە دەڵێت هەموو شتێك تەنها خەونە
بە ناونیشانی کەتوارێکی ناواخنی...ناوەوەڕا <دەرونی>

لەهەموو شتێکدا بەزیووم من... شکستم خوارد
بەڵام کاتێك کە هیچ ئارەزوویەکم نەبێت لەوانەیە؛
لە هیچ شتێکدا نەبەزیبم و شکستم نەخواردبێت
هەرچییەك کە فێری من کرابوو و پێمدرابوو وەك پێدراو

بەکارمهێنا؛ تا هەڵبێم لە پەنجەری پشتی خانووەکەمەوە
بە کۆمەڵێك بیرکردنەوەی بەشکۆ و شەوقەوە ڕۆشتمە دەرەوەی شار
بەڵام هیچ شتێکم نەدۆزییەوە جگە لە درەخت و گژوگیا
وە کۆمەڵێك مرۆڤ کە لە کۆمەڵێ مرۆڤی تری هاوچەشنی ڕۆژانەی خۆیان دەکرد
دێمەوە هۆش خۆم! پەنجەرەی پشت خانووەکە وازلێدێنم و... لەسەر کورسی ژوورەکەم دادەنیشم بۆخۆم
باشە! ئێستا دەبێت بیر لە چ شتێك بکەمەوە؟
دەبێت بە تەواوی بگۆڕێم بە <بیرکرنەوەکانم>؟ ئاخر لە بیرکردنەوەکانمدا دەمەوێت؛ هەزار شتی تر بم
وە هەزار مرۆڤی تر لە فکریاندا دەیانەوێت هەمان هەزار شت بن کە؛ هەریەك لە ئێمە دەیەوێت
ڕوونیش دیارە کە ئەگەر هیچ یەك لە ئێمەش نەبێت، ئەوا هەریەك لە ئێمە: ناتوانین...

بلیمەتم من، نا؟
لە هەمان دۆخدا هەزاران زیهنیەتی خەیاڵ پڵاو
هەروەکو من، لە خەویاندا بلیمەتن
وە مەحاڵە مێژوو تەنانەت یەك دانە لەمانەش لە خۆی و <بیرەوەریدا> بهێڵێتەوە و؛
لە سەرکەوتنەکانی ئایندەشیاندا شتێك جگە لە مشتێك پوشوپڵ بهێڵێتەوە
نا! من هیچ باوەڕێکم نییە بە خۆم...
لە هەر نەخۆشخانەیەکدا
دنیایە شێت دەبینین کە؛ سەرشارن لە یەقین!
منێك کە هیچ یەقینێکم نییە ڕاستی دەڵێم یان ئەوانە؟
منێك کە تەنانەت یەقینم بە خودی خۆشم نییە
ئێمە چوزانین؛ کێ ناڵێ هەر ئێستا لەژێر باڵکۆنی جیهاندا
چەندان بلیمەتی خەیاڵی، غەرقی خەون و خەیاڵاتەکانی خۆیان نەبوون؟
ئەم هەمووە ئارەزوو و ئامانجە درەوشاوەیە!
- بەڵێ، بەڕاستی گەورە و درەوشاوە
بەڵام لەناو ئەم هەمووە ئارەزوو ئامانجە بێشوومارەدا کامەیان دەکرێت وەدەست بێت؟
کامەیان ڕۆژی ڕووناك بە چاوی خۆیان دەبینن؟
دەنگی کامەیان دەگات بە گوێی کەس؟
ئەم جیهانەماڵی کەسانێکە کە بۆ فتوحات زەمینی لەدایك بوون
نەك ئەوانەی خەیاڵەکان فەتح دەکەن، تەنانەت ئەگەر ئەم خەیاڵکارانە، شایستەتریش بن.

لە خەیاڵەکانمدا کاری وەهام کردووە ناپلیۆن نەیکردبێت
لە سینەی خەیاڵەکانمدا، ئادەمییەتێکم دیتووە کە مەیسح بە دووچاوی سەر نەیدیتووە
لە تەنهاییەکانمدا کۆمەڵێك فەلسەفەم وەدەست کەتووە، کە کانت دەستی بەریان نەکەوتووە
بەم هەمووە نەبەردیەشەوە هێشتا پیاوێکم بێدەنگ
لەژێر سەقفی هەورەبانێکی بچووکدا لەوانەیە تا ئەبەد بە تەنها بمێنمەوە
تەنانەت ئەگەر ڕۆژێك لەوێدا نەژیم دەربارەی من دەکرێت بڵێن:
کەسێك "بۆ ئەو شتەی کە دەبوو ببێت، لەدایك نەبوو"
کەسێك کە" مرۆڤێکی ئامادەبێت"
کەسێك کە هەمیشە لەچاوەڕوانی کردنەوەی دەرگایەکدا بمێنێتەوە
بەرامبەر دیوارێك کە دەرگای پێوە نییە
کەسێك کە ئاوازێکی بێکۆتای لە قەفەزێکدا خوێند
وە دەنگی خودای لە چاڵێکی سەربەستراودا گوێ لێبوو

من باوەڕم بە خۆم هەیە؟
نا، نەخێر نە بەخۆم و نە بە هیچ کەسێکی تر باوەڕم نییە
بهێڵە سەری پڕ ئاژاوەم بە دەستی سروشت بسپێرم
تا خۆر تینی خۆی بەسەردا بپۆشێت
باران بەسەریدا ببارێت
وە با خۆی بەناو تاڵی مووەکانمدا ڕاپێچێت
دواتر باقی پێکهاتەکانی تر
ئەگەر ویستیان، یان دەستی چارەنوس ویستی بێن
چ جیاوازییەکی هەیە بێن یاخود نەیەن،
ئێمەی کۆیلانی دڵشکاوی هەسارەکان
سەرتاسەری جیهان فەتح دەکەین لە خەونەکانماندا
بەڵام کە لە خەو هەڵدەستین
هەوا مەی ئالوودەیە و مەنگ و پڕ گومان
لە ماڵەوە کە دەردەچین سەرتاسەری زەمین بێگانەیە
کۆمەڵەی هەتاوی بێگانە
کاکێشانی ڕێگای شیری بێگانە
وە ناکۆتاکانیش؛ بێگانە...

(شکولاتە بخۆ کیژۆڵە!
شکوڵاتە بخۆ!
باوەڕم پێبکە جگە لە شکولات، هیچ میتافیزیکێکی تر لەم گەردوونەدا بوونی نییە!
هەموو ڕێوڕەسمی ئاین و بیروباوەڕەکان شتێکی زیاتر لە شیرینی خواردن، فێری مرۆڤ ناکەن
شکولات بخۆ کیژۆڵە!
بە دەم و زمانی بەستراوت لەسەر یەك وەك دەستەکانت شکولات بخۆ
ئەی خۆزگە منیش دەمتوانی هێندە بە ئیسراحەت و ئارامییەوە بێ کێشە؛ شوکولاتم بخواردایە
بەڵام من وا بیردەکەمەوە کە سیم کاغەزی دەوری شوکولاتەکە -کە تەنها پارچە کاغەزێکی لایلۆنە ئەلەمنیۆمییە- دەکەمەوە
لەدەستم دەکەوێتە خوارەوە
ڕێك وەك ژیانم
کە؛
لە دەستم
کەوتە خوارەوە.)

بەڵام بەلایەنی کەمەوە لە تەڵخی و لێڵی هیچ نەبوونم
ڕەشنووسی ئەم شیعرانە دەمێننەوە
ئەم ستوونە تێکشکاوانە کە سەریان بەڕووی مەحاڵدا بەرزکردۆتەوە
بەلایەنی کەمەوە وام لێدەکەن کە؛
بتوانم بێبایەخی <هیچ بوون> بێ ڕشتنی دڵۆپێك فرمێسك پێشکەش بەخۆم بکەم
بەلای کەمەوە؛ لە پەیوەندیم بە شتەکانیشەوە شکڵێکی نەجیبانە بگرم بەخۆمەوە
کاتێك تەختە چڵکنەکەم -بوونی خۆم-
بێ ئاداب و تەرتیب

بەرەو ڕەوان بوونەکان بوەشێنم
وە ئاشکرا و پەتی لەماڵەوە دەمێنمەوە؛ ڕووت و قوت

تۆ! تۆ ئەی وجودی سوکنای کار!
تۆیەك کە بوونت نییە و دەشتوانی سکونایدەر بیت
هەرکەس پێت خۆشە ببە
تۆ، خوابانوی یۆنانی کە وەك پەیکەرێکی زیندوو باوەڕت پێدەهێنن
یاخود تۆ ئەی خانمە ئەشرافزادەکەی ڕۆم، ئۆرجیناڵ و شەڕخواز
یان تۆ ئەی شاهی کچانی بەزمگێڕی دەورگەڕ، نەرم و نیان و دڵڕفێن
یاخود تۆ؛ مارکیزی سەدەی هەژدەهەم، دیکۆڵتە پۆشە دووره دەستەکە
یا تۆ بەناوبانگترین عیشوەگەری ڕەچەڵەکی باوباپیرانمان
یاخود ئێوە ئەی شتە مۆدێرنەکان کە بەڕێکی نازانم ناوتان چییە
هەمووتان، هەرچییەك کە هەن
ئەگەر دەتوانن ئیلهامێك بە من بدەن
دڵم خاڵییە وەك دەفرێکی سەراولێژ
وەك ئەوانەی ڕۆح دێننەوە
خۆم بۆلای خۆم بانگ دەکەمەوە
وە لەگەڵ <هیچ>دا ڕووبەڕوو دەبمەوە
دەڕۆمە کەناری پەنجەرەکە و سەیری شەقامەکە دەکەم:
دوکانەکان دەبینم
پیادەڕەوییەکان
تێپەڕینی سەیارەکان
گوزەری بوونەوەرانێك دەبینم کە جلیان لەبەردایە و زیندوو دێنەپێشچاو
کۆمەڵێك سەگ دەبینم؛ کە ئەوانیش زیندوون
وە هەموو ئەمانە دوورخستنەوەیەکی نەفرەتییە کە بەکۆڵ دەیکێشم
(ناوی هەموو ئەم شتانە <غوربەتە>. غوربەتێکی هەمە لایەنە و سەرەپاگیر)

من ژیام، وانەم خوێند، عەشقبازیم کرد، تەنانەت باوەڕداریش بووم
وە ئەمرۆکەش حەسوودی بە هەرکەسێك ئەبەم کە؛
لە دۆخ و جێگای مندا نییە-تەنانەت کۆیلەیەکی بێ ماڵ و حاڵیش-
لە جلە دارزیوەکانی کۆیلەکان دەڕوانم
لە هەوکردنەکانیان
بەو درۆیانەشی تەنانەت کە دەیهۆننەوە
وە بە خۆم دەڵێم:
لەوانەیە هەرگیز نەژیابیت، وانەت نەخوێندبێت، عیشق و ئیمانت نەبووبێت هەر
(بۆچی؟ چونکە دەتوانیت ئەم کارانە هەمووی بکەیت بێ ئەوەی هیچیشیانت ئەنجام دابێت)
لەوانەیە تەنها؛ بوبیت!
وەك کلکی قرتاوی قومقومەیەك کە تا ماوەیەك قەمچ و پێچ دەدات بەخۆی...

له<خۆم> شتێکم دروستکردووه که؛ نایناسم
بەڵام شتێك که له توانامدا بوو؛ دروستم نەکرد
کراسێکی گۆڕاو که پۆشیبووم هەڵەبوو
ماسکێك که لەسەررووخسارم دامنابوو هەڵەبوو
منیان بەهەڵە لەگەڵ یەکێکی تردا گرت
بێدەنگ بووم و کەوتم له گومڕایدا
دواتر...
که ویستم ماسکەکه لەسەر دەموچاوم لابدەم
لەگەڵ دەمووچاوی ڕاستەقینەمدا بوو بوو به یەك شت
سەرئەنجام که لامدا و خۆم له ئاوێنەدا بینی
پیر بووبووم
سەرخۆش بووم و ئیتر نەمدەزانی چۆن ماسکێك لەسەر ڕووخسارم دابنێمەوه
که هەمیشه لەسەر دەمووچاوم بووه
ماسکەکەم له گۆشەیەکدا دانا و لەسەر تەختی خەوەکەم؛ تەخت بۆی نوستم
وەکو سەگێك که پاسەوانی شوقەکه بەرگەی دەگرێت و خاتری دەگرێت بۆ ئەوەی بنوێت لەبەر ئەوەی؛
ئازار بەکەسێك ناگەیەنێت
وه دەمەوێت هەموو ئەم چیرۆکه بنووسمەوه تا لەپێشینەییم بسەلمێنم

ئەی گوشراو و ئاوگی مۆسیقای دێرە بێ بەرهەمەکانم!
خۆزگه دەمتوانی ڕووبەڕووت ببمەوه ساتێك
لەبەر ئەوەی شتێك که خولقاندووته؛ منم!
لەبری ئەوەی هەمیشه دابنیشم بەرامبەری تووتن فرۆشەکەی ئەوبەری شەقامەکه
وه خود ئاگایی له بوونمدا پێشێل بکەم
وەکو فەرشێك که لەژێر پێی کەسێکی سەرخۆشدا بەهەموو بارێکاد پێشێل دەکرێت
یان ئەو پارچه فەرشه بچووکەی له بەرپێی دەرگاکاندا دادەنرێت قەرەجەکان دەیدزن و هیچ نرخێکیشی نیه
بەڵام ئێستا تووتن فرۆش دووکانەکەی کردۆتەوه و لەوێدا وەستاوه
سەیری ئەو دەکەم
به ئازار و ملێکی کەمێك چەرخاوەوه
به عەزابی ڕۆحێکی نیوه ئاگاوه

ئەو دەمرێت
منیش هەروەها
ئەو تابلۆی دووکانەکەی لێ جێدەمێنێت دوای خۆی
منیش شیعرەکانم
له کاتێکی دیاریکراویشدا؛ تابلۆی دوکانەکەشی دەمرێت
وه زمانی شیعرەکانی منیش
دوای گەردشی ئەم هەسارەیه
بەستەری هەموو ڕووداوەکانیش دەمرن ڕۆژێك
ئەوکات لەسەر هەسارەی تر، له کۆمەڵەی تر
کۆمەڵێك شتی وەك مرۆڤ بەدروستکردنی وەك شیعر درێژه دەدەن
وه له ژێر کۆمەڵێك شتی وەك تابلۆی دوکاندا ژیان دەگوزەرێنن

هەمیشە شتێك ڕووبەڕووی شتێکی تر دەبێتەوە
هەمیشە شتێك بە ئەندازەی هەموو شتەکانی خۆی بەتەنها؛ بێهودەیە
هەمیشە ناومکینەکان وەك واقعییەت ئەحمەقانەیە
هەمیشە نهێنی قوڵی دەرەوونی هێندە واقعییە کە وەك سێبەری نهێنی دەرەوە و ڕواڵەت وایە
هەمیشە یان ئەم یان ئەو
هەمیشە نە ئەم و نە ئەو

لەناکاو پیاوێك هاتە ناو دووکانی تووتن فرۆشییەکەوە (دەیەوێت تووتن بکڕێت؟)
ئەم واقعیەتە ڕێتێنەچووە ڕامدەچڵەکێنێت
لە سەرەتاوە دەستپێدەکەم وەك مرۆڤێکی پڕ وزە
وە باوەڕمەندانە تا چەند هێڵێکی تر دارێژم و بنووسم
کە تێیدا سەرپێچی لە وشەکانی پێشترم بکەم
هەروەك چۆن بیر لە نوسین دەکەمەوە
جگەرەکەم دادەگرسێنم
تامی بەچێژ و تاڵی جگەرە ڕەهام دەکات لە هەموو ئەم بیرکردنەوانە
ڕێڕەو و ڕێچکەی دوکەڵەکە بەسێرکردن تەی دەکەم
وە لە ساتێکی هەستیار و گونجاودا
چێژ دەبەم
چێژێکی کە تێدا ڕزگارم دەکات لە هەموو ئەم بیرکردنەوانە
وە دەرکی ئەو حاڵەتەی کە میتافیزیك؛ شوێنهات و کاردانەوەی دۆخی خراپە
دادەنیشم لەسەر کورسییەکەدا و جگەرەکەم دەکێشم
دەکێشم و دەیکێشم تا ئەو کاتەی دەرفەت و کاتی چارەنووس ڕێگام دەدات
(ئەگەر لەگەڵ یەکێك لەو کچانەی کە نووستوم هاوسەرگیریم بکردایە، لەوانەیە ئێستا منیش مرۆڤێکی خۆشبەخت بوایەم)
بەم باری فیچقەکردنی ئەم هەمووە بیرکردنەوە تەوژم ئاسایانەوە بەرەو ڕووی پەنجەرەکە دەڕۆم
پیاوێك کە چوویە نێو دوکانی تووتن فرۆشییەکەوە هاتە دەرەوە
(پارە وردەوە بووەکان لە باخەڵی دەنێت؟)
من نازانم ئەو پیاوە کێیە، ستیف! ئەسڵەن میتافیزیکی نییە!
(ئێستا خاوەنی دوکانی تووتن فرۆشیەکە هاتە دەرەوە)
وەك بڵێی بە ئیلهامێکی غەیبی ستیف گەڕایەوە و منی دی
دەستێکی بۆ من لە دوورەوە ڕاوەشاند و منیش هاوارێکم کرد و گوتم: خواحافیز ستیف!
وە تەواوی کائینات لەبەرچاوم هاتەوە شوێنی خۆی
خاڵی لە ئومێدەکان و ئایدیاڵەکان

تووتن فرۆشەکە؛ بزە دەکات...

پانزەی کانونی دووەمی ساڵی 1928-لشبۆنە